بەشێك لە پەیامەكانی نوور

# زللەی میهرەبانی



بديع الزمان
سعیدی نوورسی

دایناوە

فاروق رسول یحیی

★ ئەم پەیامە بدیع الزمان مامۆستا سعیدی نوورسی بە توركی داینراوە ٠
★ مامۆستا « احسان قاسم الصالحي » كردوویە بە عەرەبی ٠
★ فاروق رسول یحیى لە عەرەبی‌یەوە كردوویە بە كوردی ٠
★ چاپی یەكەم ٠
★ ١٤٠٩ك ـ ١٩٨٩ز ٠

★ چاپخانەی « الرشاد » بەغدا ٠

لەمعەی دەهەم

لە کتێبی « لەمعەلەر »

# زللەی میهرەبانی


بدیع الزمان

سعیدی نوورسی

دایناوە

فاروق رسول یحیی

کردوویە بە کوردی

# پێشەکیی وەرگێڕی عەرەبی

ناونیشانی ئەم پەیامە لەوانەیە بۆ یەکەمجار سەرنجی خوێنەری بەڕێز ڕابکێشێ ، چونکە تا ئێستا بەو واتایەی کە لێرەدا مەبەستە بەکار نەهێنراوە • بەڵام بە هۆی زۆریی بەکارهێنانی لەلایەن مامۆستا نوورسییەوە ، بووە بە زاراوەیەکی تایبەتی کە واتاکەی بریتییە لەوەی : هەر بەڵاو موسیبەتێ ڕووداوێك تووشی قوتابیی قورئان بێت ، هی کەمتەرخەمی کردنیەتی لە خزمەت گوزاریی قورئاندا • وەك بڵێی قەدەری خواوەند بەو ڕووداوە زللەیەکی لێدەدات تاکو لەو بێئاگاییە بێداربێتەوەو بگەڕێتەوە سەر ڕێی ڕاست • کەواتە مەبەست لەو « زللە »یە :

بێدارکردنەوەو تەمێ کــردنو هـــەندێ جـــاریش سەرزەنشتە • هەموو ئـەم واتایانەش لە ناونیشانەکەدا مەبەستن •

ناوەرۆکی پەیامەکەش ئـەم فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بـــە جوانی ڕوونی دەکاتەوە کە دەفەرموێ : « اذا قَصَّرَ العبدُ في العملِ ابتلاهُ اللهُ بالهمِّ »(١) •

شێخی گەیلانی ــ خوا لێی ڕازی بێ ــ واتای وشەی : « الهمّ » کە لــە فەرموودەکەدایە بەم جۆرە لێکدەداتەوە ، دەفەرموێ :

« واتە : خواوەند تووشی خەمی ڕزقێ کە بۆی نەنووسراوەو ، خەمی ماڵومنداڵو ، ئازاری خێزانو ،

---

(١) حديث حسن ، رواه احمد في الزهد مرسلا • بڕوانە : « فيض القـدير » للمناوي ، واتـە : ئەگەر مرۆڤ لە کردەوەی چاکدا کەمتەرخەمی بکات ، خوا تووشی خەفەتی دەکات •

نوقسانیو ناتەواوی لە قازانجەکانی گوزەرانی دنیاو ، بێگوێیی منداڵو ، شەڕوئاژاوەو زماندرێژیی ژنی دەکات • ئنجـــا ڕووەو هـــەر لایەك بڕوات ، پێی هەڵدەکەوێ هەموو ئەمانەی تووش دەبێ ، لە تۆڵەی کەمتەرخەمی کردنیا لە گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خواو لە ئەنجامی سەرقاڵبوونیا بە دنیاو خەڵکی دنیاوە »[۲] •

ئـــەم پەیامەش بریتییە لـە چەند ڕووداوێکی واقیعیو چەند تاقیکردنەوەیەکی پەروەردگارییانە ، کە خوای گەورە هێناونییـەتە ڕێگای ئەوانــەی لــە خزمەتگوزاریی قورئانی پیرۆزدا کاریان کردووە • هەریەکە لەوان ئــەو بەڵایەی کـــە لـــە ئەنجامی کەمتــەرخەمی کردنیەوە لـە کارکردندا تووشیبووە ، دەیگێڕێتەوە • هـــەندێ جاریش مامۆستا نوورسیخۆی لە بریی هــــەندێکیان دەیگێڕێتەوە ، دوای ڕوخسەت وەرگرتن لێیان •

---

(۲) بڕوانە : « الفتح الرباني » للشيخ عبدالقادر الكيلاني ص١٠٢ المجلس الثاني والعشرون •

ئەو بەڕێزانە ، ئەوانەن کە لە پێشەنگی کاروانی خزمەتکوزاریی قورئانداو ، بناغـــەی کۆلەکـــەی پەیمەکانی نوور بوون • خوێنەری بەڕێزیش لە کانی خوێندنەوەی باسی ئەو زللانەی لەوانە دراوە ، هەست دەکات کە چەندە بایەخیان بە کرداری دڵودەروون داوەو ، چەندە یەقینیان بووە بەوەی کە تا ئەو کردارانە پاك بن ، زیاتر ڕەزامەندیو تەوفیقی خوایان دەستگیر دەبێ • هەروەها بۆی دەردەکەوێ کە چەندە خاوەن ئـەدەب بوون لە بەرامبەر قەدەری خوای گەورەوە ، چونکە هەریەکەیان سووچی ئەو بەلایەی تووشیبووە دەخـــاتە ئەستۆی « دەروونی بەدخوازی – نەفســی ئەممارە »ی خۆیو کەمتـەرخەمیو سستیکردنیـەوە لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای گەورەدا •

مامۆستا نوورسی لە ساڵەکانی « سی »دا و پاش ئەوەی هەشت ســــاڵی بە ڕەهەندەیی لە « بارلا »دا بردەسەر ، ئـەم پەیامەی داناوە • باری گشتیی ئـەو کاتەی تورکیاش یەکپارچە بریتی بووە لە دوژمنایەتیی

توندوتیژو هێرش کردن بۆ سەر قورئان‌و شوێن‌کەوتوانی‌و هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە ئایینی ئیسلام‌و زمانی عەرەبی‌یەوە بووایە • ئەوەبوو چەند یاسایەك دانران‌و سەپێنران ، وەك : یاساکانی سەپاندنی بانگدان‌و وتاری هەینی بە تورکی‌و ، قەدەغەکردنی « قورئان »و زۆرلە خەڵك‌کردن بۆ خوێندنەوەی وەرگێڕراوە تورکی‌یەکەی‌و ، سەپاندنی جلوبەرگی ئەوروپایی‌و ، قەدەغەکردنی نووسین بە پیتی عەرەبی‌و • • • هەوچەشنی ئەمانە ، لەو یاسایانەی کە پەیوەندیی ئیماندار بە ئایین‌و قورئانەکەیەوە ببچڕێت • لەبەر ئەوە شوێن‌کەوتوانی قورئان بە توندی دەستیان بە قورئانەکەیانەوە گرت‌و ژیانی خۆیان لە پێناوی پاراستنیدا تەرخان‌کرد • ئیتر خزمەت‌کردن‌و هەوڵدانیان بۆ قورئانی پیرۆز ڕووی دڵ‌و دەروونیشی گرتبوونەوەو واتا بەرزەکانی قورئانیان کردبوو بە چەند کردارو ڕەوشتێکی جوان کە لە هەڵسوکەوتیاندا بە جوانی دەردەکەوت • ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە شەو

و ڕۆژ سەرگەرمی خوێندنەوەی بوونو ، بە جۆرێکی وردو جوانیش خەریکی لێکۆڵینەوەی تەفسیرە مەعنەوی یەکەی دەبوون کە پەیامەکانی نووروەو ، لە پێناوی خزمەت کردنی قورئاندا ، بە خەتی دەست ئەم پەیامانەیان دەنووسی یەوەو بڵاویان دەکردنەوە .. ئیتر لە کاتی بەجێ هێنانی ئەم کارانەدا چەندین بەڵگەی پتەویان لە دڵدا دادەمەزرا ، سەبارەت بە چەسپاندنی بیروباوەڕیان لە بابەتەکانی : یەکتایی خواو ، ڕاستی ی پێغەمبەرایەتی و ، حەقیقەتی قیامەت ، بەم بەڵگە پتەوانەش توانیان هەموو ئەو گومانانەی کە لە هەموو لایەکەوە لە ڕوویاندا هەڵدەتۆقین ، دەمکوت بکەن .

ئەم کارە گەورەو پیرۆزە ، شەیتانەکانی جینی و ئینسی خستە مەراقەوە ، لەبەر ئەوە هەوڵیان دا چەندین کۆسپ و تەگەرە بخەنە بەردەم ئەم کارەوە . بەڵام بەهۆی ئەو شەوق و ئیخلاسە بێ گەردەی کە لە دڵ و دەروونی خزمەتگوزارانی قورئاندا بوو ، ئەمن بەسەر ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرانەدا زاڵ بوون .

بەم جۆرە و بە فەزڵی خوای گەورە ، دڵی هەزارانیان ڕوونك کردەوەو ، لە تاریکیی سەرسامیو گومڕایی ڕزگاریان کردن •

لە خوای گەورە داواکارین ، لـە کەمتەرخەمی‌ـ کردن بمانپارێزیو ، تۆفیقمان بدات بۆ : نیازی پاكو ، تێگەیشتنی ڕاستو ، ڕاستی لە قسەو کرداردا •

وصلِّ اللهم علی سیدنا محمدٍ وعلی آله وصحبه اجمعین •

**احسان قاسم الصالحي**

لەمعەی دەهەم :

# زللەی میهرەبانی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ
مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ
ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ

سورة آل عمران / ٣٠

ئەم ( لەمعە )یە یەکێک لە نهێنییەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوون دەکاتەوە • ئەوەش بە بۆنەی باس کردنی چەند زللەیەکی میهرەبانیو پەروەردەیی

که ئەو برایانەم دران لەم خزمەتگوزاری یە بەرزو پیرۆزەی قورئاندا کاردەکەن • ئەو زللەخواردنانەشیان لە ئەنجامی چەند هەڵەو لەبیرچوون و بێ ئاگایی یەك بوو کە لە سروشتی هەموو مرۆڤێکدا هەن •

جا لەم ئایەتەدا زنجیرە کەرامەتێك ڕوون دەکەینەوە کە خوای گەورە لە خزمەتکردنی قورئانە بەرزو پیرۆزەکەیدا پیشانی دەدات • ئەو کەرامەتەی شێخی گەیلانیش ڕوون دەکەینەوە کە هانا دەباتە لای خوای گەورەو لێی دەلاڵێتەوە تاکو خزمەتگوزارانی ئەم ڕێگایە بپارێزێ •

بەڵێ ، ئەم کەرامەتە ڕوون دەکەینەوە ، تاکو کارگوزارانی ئەم ڕێگایە لە ئیخلاس و دڵسۆزی و دامەزراوی و هەڵمەت و لێبڕانیاندا زیاتر بەردەدام و دامەزراوبن •

بەڵێ ، کەرامەتی کارکردن بۆ ئەم خزمەتگوزاری یە بەرزە ، کە خزمەتکردنی قورئانی

پیرۆزە ، سێ جۆرە :

**جۆری یەکەم :**

بریتی‌یە لە ئامادەکردنی هۆکانی کارو خزمەت‌کردن‌و ، هاندانی کارگوزاران بۆ خزمەت‌کردن .

**جۆری دووهەم :**

بریتی‌یە لە دەرکردن‌و دوورخستنەوەی زیان‌و رێگرانی ئەم رێگایەو ، تەمێ‌کردنی ئەوانەی دەبنە کۆسپ لە رێگایدا ، بە تۆڵەلێ‌سەندنەوەیان .

سەبارەت بەم دوو جۆرەیان ، بەسەرهات‌و رووداوی زۆر هەیە(١) . جا لەبەر ئەوەی نەبێت

---

(١) ئەوانەی کە بە چاوی کەم سەیری قوتابییانی نووریان دەکردو ئازاریان دەدان ، بە چەندین جار لەو ئازارە زیاتر لە دنیادا سزادرانەوە ، جا با ئازاری قیامەتیش لەولاوە بووەستێ کە زۆر لە هی دنیا توندو سەخت‌ترە .

[ س. نوورسی ]

مایـــەی بێزاری ، ئـــەوا باسکردنیـــان بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین • بەڵام ئێستا دەست بە باسکردنی « جۆری سێهەم » دەکەین ، کە باسکردنی لە هەموان سووکترو تێگەیشتنی لە هەموان ئاسانترە •

**جۆری سێهەم :**

ئـەم جۆرە بریتی‌یە لەوەی کە خزمەتگوزارە دڵسۆزەکانی ڕێگای خزمەتکردنی قورئان ، هـــەر کاتێ سستی‌و کەمتەرخەمی ڕوو بکاتە کارەکەیان ، ئەوا زللەی میهرەبانی‌و بەزەیی دەخۆن‌و ، بەم جۆرە بێدار دەکرێنەوە ، ئنجا ئەوانیش بەمە ڕادەچڵەکێن‌و هۆشیار دەبنەوەو ، بە پەلەو لێبڕانەوە ، جارێکی تر ، دەست بە کارو خزمەتی خۆیان دەکەنەوە •

ڕووداوەکانی ئـــەم بەشە لـە ( سەد ) ڕووداو زیاترن • بـــەڵام لێرەدا نزیکـــەی بیست ڕووداوێک دەگێڕینەوە کە هەندێکیان بەسەر براکانماندا هاتوون ، دەدوازدەیەکیان زللەی میهرەبانییان خوارد ، بـــەڵام

نزیکـەی حەوتیـان زللەی توندوتیژی سەرزەنشتیـان لێدرا ، کە یەکەم کەسیان منی ( سەعید )ی هـەژار بوو !

ئیتر بەم بۆنەیەوە بـە تەواوی دڵنیا بووم لەوەی کە تاکو بە کاری تایبەتیی خۆمەوە خەریك‌بووبێتم‌و ، ئەم کارە تایبەتی‌یانەش لـە خزمەت‌کردنی قورئاندا سستیان کردبێتم ، یان تەنها خەریکی شتە تایبەتی‌یەکانی خۆم بووبێتم‌و وتبێتم : « من چیم لە خەڵکی داوە ؟ » .. ئەوا یەکسەر زللەکەم لێدراوەو بێدارکراومەتەوە ، لەبەر ئەوە لەوپەڕی دڵنیاییدام کە ئەم سزایە ئەنجامی سستی‌و پشت‌گوێ‌خستنی ئـەرکی سەرشانمە لـە خزمەت‌کردنی قورئاندا . چونکـە ئەو زللەیەم بـە پێچەوانەی ئەو مەبەستە لێدەدرا کە ـ لە ڕاستیدا ـ بەرەو غەفڵەت دەیبردم .

پاشان لەگەڵ براکانمدا سەرنجی ئەو ڕووداو و بێدار کردنەوە پەروەردگاریانەماندا کـە بەسـەر

براکانی ترمدا هاتبوون • پاش سەرنجدان لە یەکبەیەکیان ، بۆمان دەرکەوت کە هەرکات کاروباری خزمەتی قورئانیان پشت گوێ خستبێ ، ئەوا ئەو زللانەیان بە پێچەوانەی مەبەستەکانیان ئاراستە کراوە، لەبەر ئەوە بە تەواوی قەناعەتمان پەیداکرد ، کە ئەو سزاو ڕووداوانە یەکێکن لە کەرامەتەکانی خزمەتی قورئان •

★ ★ ★

★ نموونەی یەکەم :

« منی هەژاری دەرگانەی خوام » ! چونکە لە کاتێکدا کە خەریکی وتنەوەی وانەی حەقیقەتەکانی قورئان بووم بە قوتابییەکانم لە ( وان ) ، لەم کاتەدا ڕووداوەکانی « شێخ سەعیدی پیران » بەرپرسیارانی دەوڵەتی خستبووە دڵەتەپێو مەترسییەوە • هەرچەندەش ئەو کاربەدەستانە لە هەموو کەسێك بە گومان بوون ، بەڵام هیچ خراپەیەکیان بەرامبەرم نەکرد و هیچ بەڵگەیەکیشیان بە دەستەوە

لەبوو تاکو بیانووم پێبگرن ، هـــەر بـــەم جۆرەش ڕەفتاریان لەگەڵ کردم هەتا لە خزمەت کردنی قورئانا ا بەردەوام بووم • بەڵام کاتێ لەبـــەر خۆمەوە وتم : « من چیم لە خەڵکی داوە ؟ » و بیرم لە تەنها خــۆم کردەوەو ، لە مەیدانەکە کشامە دواوەو ڕۆشتمە ناو ئەشکەوتەکانی چیای « ئەرەك » تاکــو خۆم بۆ قیامەت دەرباز بکەم ، کاتێ ئەمەم کرد ، هاتن لەو ئەشکەوتانە دەریانهێنامو گرتیانمو ، لــە ئەیالەتێکی ڕۆژهەڵاتەوە بـــەرەو ئەیالەتێکی ڕۆژئاوا ( بۆردوور ) ڕەهــەندە ( نفي )یان کردم ••

ئنجا کاربەدەستانی ئەم شاردیش زۆر بە توندی « موراقــەبە »ی دوورخراوەکانیان دەکــردو ، دەبوا هەموو ئێوارەیەك دوورخراوەکان لە لای پۆلیس خۆیان پیشان بدایەو ، بەمە ئامادەبوونی خۆیان دەربخستایە • بەڵام منو قوتابییە دڵسۆزەکانم لەبەر خزمەتگوزاریی قورئان لەم کارەدا لە خەڵك جیاکراینەوە • بەم جۆرە هیچ کاتێ بۆ دەرخستنی ئامادەبوونم نەڕۆشتمە ئەوێو

کەسم لە کاربەدەستانی ئەوێ نەناسی • بگرە کاتێ ( فەوزی پاشا ) هات بۆ ( بۆردوور ) ، والیی شار سکالای ئەم کارەی ئێمەی لە لا کردبوو ، ئەویش لە وەڵامدا وتبووی : « ڕێزی بگرن و کارتان بە سەریەوە نەبێ » ! لە ڕاستیدا تەنها کەرامەتی خزمەت کردنی قورئانی پیرۆز بوو ئەم قسەی لە دەم دەرکرد ! چونکە کاتێ پاش ئەو ڕووداوە ئارەزووی ڕزگارکردنی خۆم و چاککردنی ئاخیرەتی خۆمم بەسەردا زاڵبووەوە ، بە جۆرێکی کاتی سستی ڕووی کردە کارەکانم لە خزمەت کردنی قورئاندا ، لەم کاتەدا ، بە پێچەوانەی مەبەستە چاوەڕوان کراوەکەم سزا درام • واتە لە بۆردوورەوە بەرەو جێگایەکی تر ڕەهەندەیان کردم ، ئەوەبوو بۆ شاری ( ئیسپارتە )یان بردم • دیسانەوە لەوێ دەستم کردەوە بە کارکردن بۆ قورئانی پیرۆز • بەلام پاش تێپەڕبوونی بیست ڕۆژ بەسەر ئەم خزمەتگوزارییەی قورئاندا ، هەندێ لەو کەسانەی مەترسیان هەبوو ، زۆر جار دەهاتن ئاگاداریان

دەکردمەوەو دەیانوت : « لەوانەیە کاربەدەستانی شار ئــەم کارەی تۆیان پێباش نەبێ ! کەواتە ئارامبگرەو بەلە مەکــە » .. لەمەوە بایەخدان بــە تەنهــا خــۆمو دواڕۆژی تایبەتیی خۆم بەسەرمدا زاڵبووەوە ، داوام لە برادەران کرد نەیەن بۆ لام . بەم جۆرە خۆم لــە مەیدانی کـــار کێشمـــایە دواوە . ئنجا جارێکی تر ڕەهەندەیی هاتەوەو بۆ جێگایەکی تری سێهەم ، کـــە ( بارلا )یە ، ڕەهەندە کرام .

لە ( بارلا )شدا هەرکات سستی ڕووی بکردایەتە کارکردنم بۆ قورئانو ، بایەخم تەنها بە نەفسی خۆم بدایەو تەنها هـــەوڵم بۆ چارەسەرکردنی کاروباری قیامەتی خۆم بوایە ، ئـــەوا یەکێك لە هەزدیهاکانی ئەهلی دنیا بەسەرمدا زاڵدەبوو و ، موونافقێك ڕێگای پێدەگرتم .

جا برایانم ! ئامادەم هەشتا ڕووداوی وەك ئــەم جۆرەتان بۆ بگێڕمەوە ، کە تەنها لە ماوەی ئەو هەشت .

ساڵەی مانەوەم لە بارلادا بەسەرم هاتن • بەڵام لـــە ترسی بێزاربوونتان هەر بەوەندەی باسم کــردن وا دێنم •

برا خۆشەویستەکانم ! وا ئـــەو زڵلە پڕ لـــە میهرەبانی‌یانەی لێم دران ، بۆم باس‌کردن • جا ئەگەر ڕێگــام بدەن ئـەو زڵلانـەش کـە لـــە ئێوە دراون بیانگێڕمەوە ، ئەوا ئەوانیش دەگێڕمەوە • هیواداریشم دڵگران نەبن • خۆ ئەگەر هی وایشتان بێ حەز بـە گێڕانەوەی نەکات ، ئەوا ناوی ناهێنم •

★ ★ ★

★ دووهەم : « عبدالمجید »ی برامە •

کـــە یەکێکە لـــە قوتابی‌یە خۆبەخت‌کـــەرو کارگوزارو دڵسۆزەکانم •

کاتی خۆی خانوویەکی خنجیلانەی لــە شاری ( وان ) هەبوو ، گوزەرانیشی بە گوێرەی دڵ بوو ،

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بە دەرس‌وتنەوەوە خەریك بوو • پاشان بارودۆخێکی وا هاتە پێشەوە کە کاروباری خزمەت‌کـــردنی قورئان پێویستی دەکـــرد بـەرەو شوێنێکی دووری سەرسنوور بڕۆم ، ویستم لەگـــەڵ خۆمدا بیبەم ، بەڵام ئەو بەمە ڕازی نەبوو ، وەك بڵێی وای پێ باش‌بێ کە منیش نەڕۆم،چونکە لەوانەیە کارەکە شتێکی لەبارەی سیاسەتەوە تێکەڵ بێ‌و ، دوور نیـە دووچاری ڕەهەندەیشی بکات‌و ، وای بـە باش زانی کە هەر لەوێ بمێنێتەوە • ئیتر بـەم جۆرە لەگەڵماندا بەشداریی نەکرد • بـەڵام زللەکەی وا لێدرا کــــە پێچەوانەی مەبەستەکەی خـۆی هاتەدی‌و ، هـەرگیز چاوەڕێی شتی وای نەدەکـــرد • ئەوەبوو لـــەوێ ڕەهەندەیان کـردو لـــە خانوە جوانکیلەکەی دوور خرایەوەو ناچار کرا بڕوات بۆ « ئەرگانی »(٢) •

---

(٢) ئـەرگانی : قـەزایەکی سـەر بـە ئـەیالەتی « ئەلازیغ »ی تورکیایە و ، (٥٠٠کم) بـەرەو ڕۆژئاوا لە « وان »ەوە دوورە • [ وەرگێڕ ] •

★ سێهەم کەس « خەلووصی »یە(٣) .

کە یەکێکە لە هەرە خزمەتگوزارەکانی قورئان .
کاتێ رۆشتەوە بۆ شارەکەی خۆی و لە هەموو لایەکەوە هۆکانی لەزەتبردن لــە جوانیو بەختەوەریی دنیــا دەورەیان داو ، بە دیداری دایكو باوکی شاد بوو لە پاش ماوەیەکی دوورو درێژی جوداییو دووریو ، بە جلو بەرگی ئەفسەریو ڕوتبەی بەرزەوە گەڕایەوە شارەکەی خۆی ، دنیای خۆشو ڕەنگین هاتە پێشچاو .
ئەمەش وای لێکرد کە هەندێ سستی لــە خزمەت‌گوزاریی بێگەردیێ قورئاندا بکات .

بەڵێ ، ئەوانەی لە بواری خزمەتکردنی قورئاندا کار دەکەن ، دەبێ یان پشت لە دنیا هەڵکەن ، یان دنیا پشتیان لێهەڵدەکات ، تاکــو بەوبەڕی لێبڕانو

---

(٣) خەلووصی لە سەربازگەیەکی نزیکی « بارلا »دا ئەفسەر بووە . بڕوانە : « ذكريات عن سعيد النورسي » ترجمة : اسيد احسان قاسم ص٤٢ [ وەرگێڕ ] .

ئیخلاس و چوست و چالاکی کارەکانیان ڕاپەڕێنن •

جا هەرچەندە « خەلووصی » مرۆڤێکی خۆڕاگرەو دڵی ئەوەندە دامەزراوە کە لە جێی خۆیدا نابزوێ ، بەڵام ئەم بارودۆخە دنیاییە جوانەی کە لە ڕوویدا پێکەنی ، سستی کردەوەو ، هەندەی نەبرد زللەیەکی میهرەبانیی لێدرا • ئەوەبوو بە درێژیی دوو ساڵی ڕەبەق چەند موناففیك ژیانیان لێ تاڵ کردو لەزەتی دنیا بێبەشیان کرد ، تا وایان لێکرد بێز لە دنیا بکاتەوەو پشتی تێبکات و ، دنیاش بێز لەم بکاتەوە. پشتی تێ بکات ، ئنجا بەوپەڕی چوست و چالاکییەوە هاتەوە ژێر سایەی ئاڵای خزمەتگوزاریی قورئان و بە توندی دەستی پێوە گرت •

★ چوارەم : « حافظ ئەحمەدی موهاجیر »(٤) •

وا ئەوەی بەسەری هاتووە ، خۆی بۆتانی دەگێڕێتەوە :

---

(٤) مەبەست لە وشەی : « حافظ » لەبەرکەری قورئانە • [ وەرگێڕ ] •

« بەڵێ ، لـە خزمەتکردنما بۆ قورئانی پیرۆز ئیجتیهادم کردو ، لەم ئیجتیهادەشا بە هەڵەدا چووم • چونکە بیرم تەنها لە ڕزگارکردنی ئاخیرەتی خـۆم کردەوەو ، هەر ئەوەندەی کە ئـەم ئارەزووەم تیـا دەرکـەوت ، لـە خزمەتکـردنی قورئانی پیرۆز خاوبوومەوەو ، یەکسەر زللەیەکی میهرەبانیم لێدرا ، هەرچەندەش توندوتیژ بوو ، بگرە لە ڕاستیدا زللەیەکی توندو سەرزەنشتێکی بەتین بوو • لـە خوای گەورە ئومێدەوارم بیکاتە کەفارەتی ئەو غەفڵەتەی کـە لـە خزمـەتگوزاریی قورئاندا لێـم دەرکـەوت •• ڕووداوەکەش بەم جۆرەی خوارەوەیە :

مامۆستا بەو بیدعەتانەی تازە پەیدابووبوون ڕازی نەدەبوو(٥) • جا لەبەر ئەوەی ئەو مزگەوتەی نوێژی

---

(٥) وەك نوێژ کردن و بانگدان و قورئان خوێندن و هاوچەشنیان بـە زمانی تورکی ، لەوبیدعـەتە نوێیانەی کە لە سەرەتای ساڵەکانی بیستەوە تا ساڵی ١٩٥٠ لەتورکیـا دروسـت کـران و بەسەرخەڵکیدا دەسەپێنران • [ وەرگێر ] •

جەماعەتم تیا دەکرد لە شوێنی نیشتەجێبوونی مامۆستاوە نزیکبوو و ، مانگە پیرۆزەکانی : ( ڕەجەب ، شەعبان ، ڕەمەزان )یش لە هاتندابوون ، ئەوا ئـەم وتووێژەی خوارەوە بە دەروونمدا هات‌و نەفسم پێی وتم :

ئەگەر بە جۆرە بیدعەتەکە نوێژ نەکەم ، لـــە کارەکەم‌قەدەغە دەکرێم • خۆ ئەگەر واز لە مزگەوتیش بێنم‌و نەبمە ئیمامی نوێژکەران ، مانای وایە پاداشتێکی زۆرم لـە دەستدەچێ بە تایبەتی لـــەم سێ مانگـــە پیرۆزەدا • سەرەڕای ئەمانەش خەڵکی گەڕەك لەسەر وازهێنان لە نوێژی جەماعەت ڕادێن •• جا ئا لەم کاتەدا لـە دەروونەوە حەزم دەکرد مامۆستا ـ کە لـە ڕۆحم بـەلامەوە ئازیزترە ـ بۆ ماوەیـــەکی کاتی ئاوایی ( بارلا ) بەجێ‌بهێڵێ‌و بۆ جێگایەکی‌تر بڕوات ، تاکو بە جۆرە بیدعەتەکە نوێژ بکەم • بەڵام من ئەوەم لەیاد چوو کە ئەگەر مامۆستا ـ با بۆماوەیەکی کاتیش بێ ـ ئێرە بەجێ‌بهێڵێ ، مانای وایـــە سستی ڕوودەکـــاتە خزمەت‌گوزاریی قورئان ••

ئا لەم کاتەدا سزادرام و[٦] سزاکەش هەرچەند بە بەزەیی بوو ، بەڵام زللەیەکی ئەوەندە توندو بە هێز بوو کە لە پاش سێ مانگ هۆشم بە خۆمدا هاتەوە • جا ئومێدی گەورەم بە ڕەحمەتی فراوانی خوای گەورەیە کە هەموو دەقیقەیەکی ئەو موسیبەتەم بۆ بکات بە پەرستنی ڕۆژێکی تەواو ، وەك مامۆستا خۆی - بەو ئیلهامەی کە خوا تێی گەیاندووە - پێی ڕاگەیاندم • چونکە ئەو هەڵەیە بە هۆی هیچ هاندەرێکی خۆیی و کەسییەوە نەبوو ، بەڵکو هۆکەی هەڵەکردنم بوو لە ئیجتیهادەکەمدا و ، لەوەوە بوو کە بیرم تەنها لە ئاخیرەتی خۆم و پاداشت پەیداکردن بۆ ( تەنها خۆم ) کردەوە ، •

★ پێنجەم : « سەیید حەققی »یە •

لەبەر ئەوەی خۆی لێرە لەگەڵماندا ئامادە نییە ،

---

(٦) لێرەدا سزاکەی باس نەکردووە • لەوانەیە بە پێویستی نەزانیبێ باسی بکات • [ وەرگێڕ ] •

وا من لـه بریی ئەو دەیگێڕمەوە ، هەروەك لـه بریی خەلووصی گێڕامەوە • دەلێم :

سەید حەققی بەو پەڕی ڕێکوپێکی کرو ئەرکی سەرشانی خۆی لە خزمەتگوزاریی قورئاندا بـــەجێ دەهێنا • بەلام کاتێ کە بەرپرسیارێکی نەفام کرا بـە « قزی » ، سەید حەققی بیری کردەوە ئەوەی کـە هەموو ئەو پەیامانەی لـە لای هەن ، بیانشارێتەوە • ئەمەش لەبەر ئەوەی نـــەوەك خۆیو ماموستای بـــە هۆیانـەوە توشی ئەشکەنجە ببن • ئـەوە بوو بـە جۆرێکی کاتی وازی لە خزمەتگوزاریی نوور هێنا • بەلام یەکســەر زللەیەکی میهرەبانیی ئاراستە کـرا ، چونکە دەعوایەکی لەسەر کرایەوە کــە خەریك بوو ناچاری بکات هەزار لیرە بدات تا ڕزگاری ببێ لێی • بـــەم جۆرە سالێکی ڕەبەقی بـــە هەڕەشەلێکراوی بردەسەر • تاکو لە ئەنجامدا گەڕایەوە لامان بۆ کارو فەرمانبەرییەکەی خـــۆیو داوای خزمەتگوزاریی

قورئانی کرد • ئیتر خواوەند لەو گێژاوە دەربازی کردو حوکمەکەی لەسەر هەڵگرت‌و تەبرییە بوو •

پاشـــان کاتێ کە دەرگای مەیدانێکی نوێ بـۆ خزمەت‌کردنی قورئان لە قوتابییان کرایەوە، کە بریتی بوو لە نووسینەوەی قورئانی پیرۆز بە خەتی دەست‌و بە جۆرێکی تازەو جوان(۷) ، سەیید حەققی بەشـــی

---

(۷) چونکە ئەو کاتانە لە تورکیا قورئانی پیرۆز بە حەرفی عەرەبی قەدەغە کرابوو • ئـەمە لـــە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە ئەم قورئانـ نووسینەوەیەی کـە لەم پەیامەدا باسی هـەیە بە جۆرێکی وا نووسرایەوە کە هەرچی وشەی ( الله )یە لـە لاپەڕەکانیدا لە ئاسـتی یـەکتر دەرچووربوون ، تاکو ئـەم لایەنـەی ئیعجـازی قورئان پیشانی ئەوانە بدات کە لە مەسەلەی ئیعجازی قورئاندا هەر لەوەندە تێدەگەن کە بە چـــاو ببینـــــن • خۆشـــــنووسی بـــەناوبانگ حامیـــــدی ئامێـــــدی ـ خوا لێی خۆش بێ ـ بە خەتە جوانەکەی خۆی دانەیەکی لەبەر ئەو قورئانە نووسییەوە کە ئەو =

خۆی درایێو ، ئەویش بـــە ڕێکوپێکی بە کارەکەی خۆی هەڵساو جزمێکی تەواوی قورئانی تا بلێی بـــە جوانی نووسی • بەڵام لەبەر ئەوەی خۆی لای‌وابوو کە لە باری گوزەرانەوە لە تەنگانەدایە ، ئەوا بە بێ ئەوەی ئێمەش پێی بزانین پـــەنای بردەبەر وەکیلی دەعوای ئەموئەو لە دادگاکاندا ، کاتێکی زانی زللەیەکی تری میهرەبانیی لێدرا • ئەویش ئەوەبوو کـــە ئـــەو بەنجەیەی قورئانی پیرۆزی پێ‌دەنووسی ، چەمی‌یەوە ! ئێمەش لەبـــەر ئەوەی ئاگاداری ئەو کارەی ئـــەو نەبووین ، ئەوا سەرمان سووڕدەماو نەمان‌دەزانی هۆی ئەمەی بەسەر پەنجەیدا هات چییە • تا وای لێ کـــرد نەتوانێ لە خزمەت‌کردنی قورئاندا بەردەوام بێ ••
لە پاشاندا تێ‌گەیشتین کە ئەم خزمەتە پیرۆزە نایەوێ

---

=

قوتابییانـــەی نوور نووسیبوویانەوە • شـــایانی باسە : ئەم دەستنووسەی حامیدیش چەندین جار چاپ کراوەو بلاوکراوەتەوە •

[ وەرگێڕ ]

ئەو پەنجە پاکانە تێکەڵی شتی چەپەڵ بن[8] • وەك بڵێی پەنجەکە بە زمانی حاڵ هاوار دەکات و دەڵێ : « دروست نیە لەم لاوە لـــە نووری قورئانی پیرۆزم هەڵبکێشی و پاشـــان بچی لەولاوە نوقمی تاریکستانی دەعواکانم بکەیت » • هەرچۆن بێ ئەمە بێداری کردەوە•

بەهەرحاڵ من خۆم لە جێی « خەلووصی » داناو لـــە بریی ئـــەو بەسەرهاتەکەیم گێڕایـــەوە ، سەیید حەققیش وەك ئەو وایە •• جا ئەگەر بەمەی کە لـــە وەکیلی خـــۆی گێڕامەوە ڕازی نەبێ ، با خـــۆی بەسەرهاتی ئەو زللەیە بگێڕێتەوە کە لێیدرا •

★ شەشەم : « سەیید بەکر »ە •

جا لەبەر ئەوەی خۆی لێرە نیەو ، هەروەك لە بریی عبدالمجیدی برام گێڕامەوە ، ئەوا لە بریی سەیید بەکریش دەیگێڕمەوە ، چونکە وەکو یەك وانو ، پشت

---

(٨) چونکە دەعواکانی دادگا حەق و ناحەقی تیـــا تێکەڵ بە یەکتر دەبن • [ وەرگێڕ ] •

بــه ئیخلاس‌و وه‌فــار براده‌ری‌یه ڕاسته‌قینه‌که‌ی‌و دامه‌زراویی له خزمه‌تدا ده‌به‌ستم‌و ، ده‌بمــه وه‌کیلی خۆی له گێڕانه‌وه‌ی ڕووداوه‌که‌دا ..

هه‌روه‌ك « سه‌ید سوله‌یمان » و « حافظ تۆفیقی شــامی » و هاوچــه‌شنیان له برا خۆشــه‌ویسته‌کان ده‌یگێڕنه‌وه :

ئــه‌و کەسه‌ی له ئه‌سته‌مبووڵ بــه چاپکردنی « په‌یامی حه‌شر » هه‌ڵسا ، سه‌ید به‌کر بوو ، ئنجــا ویستمان په‌یامی « ئیعجازی قورئان »یش له‌وێ چــاپ بکه‌ین ، ئه‌مه‌ش له پێش هێنانی ئــه‌م پیته لاتینی‌یانه‌ی ئێستا . ئه‌وه‌بوو نامه‌یه‌کم بۆ نارد تیایدا بۆم نووسی : « پاره‌ی چاپکردنی ئه‌م په‌یامه‌و په‌یامه‌که‌ی تریشت بۆ ده‌نێرین » . بــه‌ڵام کاتێ لێکی‌دابووه‌وه که پاره‌که ده‌کــاته « ٤٠٠ » لیره‌و ، ده‌یشزانی من لــه ‌چ هه‌ژاری‌یه‌کدام ، ئه‌وا ویستبووی به پاره‌ی خۆی چاپی بکات ، ئنجا به خه‌یاڵیدا هاتبوو که من ڕازی نیم ئــه‌و

پارەکە بدات •• بەم جۆرە نـەفسی لە خشتەی بردو دەستی بە چاپکردنی پەیامەکە نەکرد • لە ئەنجامی ئەم بیرکردنەوەیەی ئەودا زیانێکی گەورە لە خزمەت ـ کردنی قورئان کەوت •• پاشان کە دوو مانگ بەسەر ئـەمەدا تێپەڕی ، (۹۰۰) لیرەی لێدزرا ! ئـەمەش زللەیـــەکی میهـــرەبانی بوو ، کـــە لـە بەرامبەر سستی کردنیـەوە لـە کـارەکـەیدا لێیدرا • لـــە خواداواکارین ئەو سامانە لەدەستچووەی بــــە خێرو سەدەقە بۆ بنووسێ •

★ دەوتەم : « حافظ تۆفیق »ە •

که بە نازناوی « شامی » بەناوبانگە : وا خـــۆی بەسەرهاتەکەیتان بۆ دەگێڕێتەوە :

بەڵێ : من بە چەند کارێکی وا هەڵـسام کە لـە خزمەتکردنی قورئان سستیان کـــردمەوەو ، لـــە ئەنجـامی ئـەمەیشەوە زللەم خـواردو ، بـەوپـەڕی بێگومانیشەوە دڵنیام لەوەی کە ئـەو زللەیەم بـــەو هۆیەوە لێدرا • چونکە ئەو کارانەی کـــە پێیـــان

هەڵسامو لەو خزمەتە سستیان کردمەوە ، لە ئەنجـامی هەڵەو نەزانینم بوو لە بیرکردنەوەو بۆچوونەکانمدا •

زللەی یەکەم :

کاتێ مامۆســــتا نووسینەوەی قورئانی پیرۆزی بەسەرماندا دابەش کرد ، من نووسینەوەی سێ جزمم بەرکەوت ، چونکە خواوەند نیعمــەتی خۆشنووسیی خـــەتی عــــەرەبیی وەك نووسینی خــــەتی قورئان پێبەخشیوم • جا شــــەوق و خۆشیی نووســـینەوەی قورئان لە نووسینەوەی پەیامەکان سستیان کردمەوە ، جگە لەوەی کە هەندێ لە خۆبایی‌بوونم لەمەوە تووش بوو ، چونکە لـەم کارەدا خـۆم لـە هـوەڵەکانم بـە پێشکەوتووتر دەژمارد ، بەهۆی ئەوەی کـــە هیـــچ پێویستییەکم لە خۆمدا شك نەدەبرد بە هیچ کەسێ سەبارەت بە نووسینی خەتی عەرەبی ، بــە ڕادەیەکی وا کە کاتێ مامۆستا ویستی لە بارەی نووسینی خەتی عــەرەبی‌یەوە هــــەندێ ئامۆژگاریم بکـــات ، بـــە لەخۆبایی‌بوونەوە وتم : « ئەمە ئیشی منە •• دەیزانم••

پێویستم بە پێوتن نییە ! » • لە ئەنجامی ئەم هەڵەیەمدا زللەیەکی میهرەبانیم چەشت • ئەوەیش ئەوەبوو کە نەمتوانی بگەمە پلەی هاوەڵەکانم لە نووسینەوەدا ، چونکە ئەوان لە جوانیی نووسینەوەکەدا پێشم کەوتن• منیش سەرم لەمە سووڕدەماو دەموت : خۆ من پێشیان کەوتبووم ، دەی بۆ وا دواکەوتم ؟ •• بەڵام ئێستا تێدەگەم کە ئەوەی من سەرم لێی سووڕدەما ، بریتی بوو لە زللەیەکی میهرەبانیی خواوەند ، کە کەرامەتی خزمەتکردنی قورئانی لێیدام • چونکە ئەم خزمەتە لە خۆبایی‌بوون قبوول ناکات •

## زللەی دووهەم :

**لە وڵاتەکەدا خۆم بە غەریب دەزانی**(٩) ، **بەڵکو لە ڕاستیشدا غەریب بووم • جا بۆ نەهێشتنی بێزاریی غەریبی ، تێکەڵیی کەسانێکم کرد کە بە هۆی دنیا لەخۆیان بایی بووبوون ، ئیتر لەوانەوە فێری ڕیاکاری بووم • جگە لەوەش ، بە بۆنەی گوێنەدانم بە**

---

(٩) چونکە خەڵکی شامە [ وەرگێڕ ] •

دەستوورە گرنگەکەی مامۆستا سەبارەت بە قەناعەت‌و ئیقتیصادەوە ، هەژاری‌و دەست کورتی سەری تێ کردم ـ ئەمەش سکالآی حاڵ نییە ـ هەرچەندەش مامۆستا ئاگاداری ئەم شتانەی کردم ، بگرە هەندێ جاریش سەرزەنشتی دەکردم ، بەلآم ـ بە داخەوە ـ نەمتوانی لەم گێژاوە خۆم دەرباز بکەم • وا داوای لێبووردن لە خوای گەورە دەکەم •

جا ئەم دوو حاڵەتەی باسم کردن ، شەیتانەکانی جینی‌و ئینس دەرفەتیان لێوەرگرت‌و ، خزمەت کردنم بۆ قورئان سستی ڕووی تێ کردو ، بەم هۆیەوە زللەیەکی توندوتیژم خوارد ، بەلآم هی میهرەبانی بوو • ئیتر بەبێ هیچ گومانێك دڵنیا بووم لەوەی کە ئەم زللەیە لەوێوە هاتووە ، زللەکەش بەم جۆرەی خوارەوە بوو :

هەرچەند بۆ ماوەی هەشت ساڵی ڕەبەق نووسەرەوەی پەیامەکانی نوور بووم‌و مامۆستا دەیوت‌و من دەمنووسین‌و تێکەڵی‌یەکی ئەوام لەگەڵ ئەم پەیامانەدا

هەبوو ، بەڵام ـ بە داخەوە ـ لە نوورو ڕووناکیی ئەو پەیامانە ئەوەندەم دەست نەکەوت کە ئەوانیتر لە ماوەی هەشت مانگدا دەستیان دەکەوت . جا منو ماموستـــا ـ هەردووکمان ـ ســەرمان لــەم کارە سووڕدەماو دەمانوت : بۆ دەبێ وابێ ؟ واتــە : بۆچی ڕووناکی حەقیقەتەکانی قورئان تێکەڵی نودڵم نابن ؟ .. زۆر بــە دوای هۆکانی ئــەم کارەدا گەڕاین ، وا ئێستـــا بەوپەڕی بێگومانییەوە دەزانین کە :

ئــەو حەقیقەتانە یەکپارچە نوورو ڕووناکین ، دیارە « ڕووناکی » لەگەڵ « ڕیا » و « کلکە لەقێ بۆ ئەمو ئەو »دا کۆ نابنەوە ، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو ڕووناکییەکان لێم دوورکەوتنەوەو ، سەبارەت بە من وەك شتێکی ناموٚیان لێهات ..

لە خوای گەورە داواکارم ئیخلاسی تەواوم لــە کارکردندا پێببەخشێو ، لە « ڕیا » و « زەلیلبوون لەبەردەم ئەهلی دنیا » بمپارێزێ .

تکا لە هەموشتان دەکەم ـ بە تایبەت ماموستا ـ

که به کوڵ دوعام بۆ بکەن .

پڕ قسوور

**حافظ تۆفیقی شامی**

★ **هەشتەم : « سەیرانی »یە .**

ئەم برایە هاوشانی خەسرەوەو ، یەکێکە لە قوتابییە زیرەکو چالاکەکانمو ، لەوانەیە کە زۆر موشتاقی پەیامەکانی نوورن .

ڕۆژێکیان ڕەئیی قوتابییانی ئەسپارتەم وەرگرت سەبارەت بە مەسەلەی « التوافق » کە کلیلێکە بۆ نهێنییەکانی قورئانی پیرۆزو زانیاریی پیتەکان ( علم الحروف ) . هەموو قوتابییان بەوپەڕی چوستو چالاکییەوە لە گفتوگۆکەدا بەشدارییان کرد ، ئەم نەبێ . بەم بەشدارینەکردنەش ڕانەوەستا ، بەڵکو لەبەر ئەوەی بایەخی بە شتیتر دەدا ، ئەوا دەیویست منیش والێ بکات واز لەو حەقیقەتانە بهێنم کە عیلمی یەقینم پێیان هەیە . پاشان نامەیەکی توندوتیژی وەهای بۆ ناردم کە لە دەروونەوە زۆر کاری تێکردمو ،

لەبەرخۆمەوە وتم : داخی گرانم ئەم قوتابی یە وریایەم لەدەست دەرچوو • هەرچەندەش ویستم مەسەلەکەی زیاتر بۆ ڕوون بکەمەوە ، بێسوود بوو ، چونکە بابەتەکە شتی تری تێکەڵ بوو بوو • لە پاش ئەمە زللەیەکی میهرەبانی ی لێدراو ، نزیکەی ساڵێك چووە بەندیخانەوە •

★ **نۆهەم : « حافظ زوهدیی گەورە »یە •**

ئەم برایە سەرپەرشتیی ئیشوکاری قوتابییانی نووری شاری « ئەغراص »ی دەکرد • بەڵام وەك بڵێی بەو پلەو ڕێزە بەرزەی کە قوتابییانی نوور هەیانەو بە بۆنەی پەیڕەوی کردنیان بۆ سوننەتی پیرۆزو خۆپاراستنیان لە بیدعەت ، دەستیان کەوتووە ، ڕازی نەبوو و حەزی کرد ئەم پلەیەی لای ئەهلی دنیا دەستبکەوێ • لەبەر ئەوە فەرمانبەری یەکی لە دنیاپەرستان وەرگرت کە بریتی بوو لە : « فێرکردنی بیدعەتێکی خراپ » • بەڵێ ئەم فەرمانبەری یەی گرتە ئەستۆی خۆی • بەمەش هەڵەیەکی گەورەی کرد ،

کە پێچەوانەی مەسلەکی ئێمەیە ، چونکە مەسلەکمان بریتی‌یە لە شوێن‌کەوتنی سونەتی پیرۆزی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم .

پاشـــان زللەیەکی تا بڵێی سامناکی خوارد ، چونکە ڕووداوێکی وای بە سەردا هات کە نزیك‌بوو ئابڕووی خۆی‌و کەس‌وکاری بـــە جارێ ببات . ئەم ڕووداوە - بە داخەوە - حافظ زوهدیی بچووکیشی گرتەوە ، هەرچەند شایانی ئەم زللەیە نەبوو .

لە خوا داواکارین ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە وەك عەمەلیاتێك وابێت بۆ دڵ‌ودەروونی‌و ، دڵی لە دنیا دوور بخاتەوەو ، وای لێ‌بکات کە تەنها لە پێناوی خـــوادا هەڵبسێ بە کارکردن بۆ قورئانی پیرۆز ، تاکو لـــە قیامەتدا سوودی پێ‌بگەیەنێ .

★ دەهەم : « حافظ ئەحمەد »ە .

ئەم برایە بۆ ماوەی سێ ساڵی ڕەبەق پەیامەکانی نووری دەنووسی‌یەوەو لـــە ڕووناکی‌یەکانی ئـــەم پەیامانەی هەڵدەگۆزی‌و ، بەوپەڕی خۆشەویستی‌یەوە سەرگەرمی ئـــەم کارەی خۆی بوو . پاشان تێکەڵی

ئەهلی دنیا بوو بەو نیزەی لە ئزاریان ڕز کاری ببێو ، بتوانێ قسەی باشـــیان پێ ڕابکەیەنێو ، هەندێکیش پلەوپایەیەن لا پەیدا بکات . ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە حـــەزی دەکـــرد سەبارەت بە ئیشوکاری دنیـــاو گوزەرانەوە هەندێ دەست فراوانی پەیدابکات ، ئیتر ئەو شەوقەی جرانی کز بوو و دنیاویستانیش لـــەم لایەنەوە سوودیان لە لاوازیی ئەم بینی . لە ئەنجامی ئەمەدا سستی ڕووی کردە کارەکانی لە خزمەت کردنی قورئانداو ، ئنجا پاش ئـــەمە دوو زللەی بەیەکەوە لێدرا :

یەکەمیان ئەوەبوو : کە هەرچەند دەست کورت بوو ، بەڵام خێزانەکەی پێنج کەسی تری زیادکرد ، ئنجا بە ڕاستی کەوتە تەنگانەی گوزەرانەوە .

دووهەمیان ئەوەبوو : کە هەرچەندە ئەم مرۆڤێکی هەستناسك بوو و ، هیچ قسەیەکی لە کەس قبووڵ نەدەکرد ، کەچی بێئەوەی بە خۆی بزانێ بوو بـــە داردەستی تەڵەکەبازان ، بە ڕادەیەك کە بە تەواوی

پلەوپایەکەی خۆی لـەدەست داو ، وای لێهات زۆر کەس دەنگیان لێدابڕی‌و بەم جۆرە هاوەڵیتیی ئەوانی لە دەست دەرچوو ..

بەهەرحاڵ ، لە خوا داواکرین لە ئێمەو ئەویش خۆش ببێو ، یارمەتیی بدات لەو بێ ئاگایی‌یە بێـداو بێتەوەو بە باشی لە هەموو شتێ تێبگات‌و بگەڕێتەوە بۆ ئەرکی خۆی لە خزمەتی قورئاندا .

★ یازدەهەم :

لەوانەیە لەوەی دەینووسین ڕازی نەبێ ، لەبەر ئەوە لێرەدا هیچی لەبارەوە نانووسین .

★ دوازدەهەم : « غالبی موعەللیم »ە .

ئـــەم برایە بەوپەڕی ڕاستی‌و ئیخلاسەوە لـــە نووسینەوەی پـــەیامەکاندا خزمەت‌گوزاریی تا بڵێی گەورەو زۆری‌کرد و ، لە بەردەم هیچ گیرو گرفتێکدا با زۆر گـــەورەش بووبێت ، لاوازیی نـــەنواندو ، زۆربەی کات ئامادەی دەرسەکان دەبوو و بەوپەڕی شەوق‌و بایەخدانەوە گوێی ڕادەگرت‌و ، پەیامەکانیشی

بۆ خـــۆی دەنووسی‌یەوە   بگرە ، هـــەموو وتەکان « سۆزلەر »ی بۆ خـــۆی‌و ، « مەکتووبات »یشی بۆ یەکێکی‌تر بە پارە نووسی‌یەوە • مەبەستیشی لـــەم نووســـینەوەیەدا بلاوکـــردنەوەی پەیامەکان لـــە شارەکەیداو ڕێنموونی کردنی برادەرانی خۆی بوو •

پاش ئەمە ، بە هۆی چەند خەیاڵ‌و ختوورەیەکەوە کە سەری تێ‌کردبوو ، لە کارکردن سست بووەوەو وەکو جارانی هەڵنەسا بە بلاوکردنەوەی پەیامەکان • بەم جۆرە ڕووناکیی ئەم پەیامانەی لە بەرچاوی خەڵکیدا داپۆشی •

کتوپڕ ڕووداوێکی توندو تیژی پڕ لـــە ئازاری بەسەرداهات ، کە بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو بە هۆیەوە لـــە خەفەتدا بوو ، جاران بە بۆنەی بلاوکردنـــەوەی پەیامەکانەوە چەند فەرمانبەرێك دوژمنایەتیین دەکرد ، بەڵام دوای ئەم ڕووداوە ژمارەیەکی زۆری ستەمکار بوون بە دوژمنی • بەم جۆرە چەند برادەرێکی ئازیزی لەدەست دا •

★ سیازدەهەم : « حافظ خالید »ە •

وا خـــۆی بەسەرهاتەکەیتان بۆ دەگێڕێتەوە •

کاتێ بەوپەڕی شـــەوق‌و حەماسەتەوە خەریکی نووســـینی مسوەددەکانی پەیامەکـــانی نوور بووم • وەزیفەیەکی بەتاڵ ، کـــە پێش‌نوێژیی مزکـــەوتی گەڕەکەکەمان بوو ، لە ئارادا بوو • جا لەبەر ئەوەی زۆرم حەزدەکرد جبەو مێزەری زانایانە لەبەر بکەم ، ئەوا بە جۆرێکی کاتی لە کار سست‌بوومەوەو لاوازی ڕووی‌کردە هیممەت‌و شەوقم لە خزمەتی قورئانداو ، بـــەم جۆرەو بـــە هۆی نەزانیمـــەوە لـــە مەیدانی خزمەت‌گوزاریی قورئان کشامە دواوە •• کاتێکم زانی زللەیـــەکی میهرەبانیم بـــە پێچەوانەی مەبەستەکەم چەشت •

چونکە هەرچەندە « مفتی » بەڵێنی زۆری دامێ لـــەو وەزیفەیە دام‌بمەزرێنێ‌و ، هەرچەندەش زووتر نزیکەی نۆ مانگ ئـــەم وەزیفەیەم دیبوو ، کـــەچی مەبەستەکەم نەهاتەدی‌و لە کردنەبەری جبەو عـــەمامە بێ‌بەش کرام •

ئیتر دڵنیابووم لەوەی کە ئەمزنلەیە لە ئەنجامی ئەو کەمتەرخەمی یەم بوو کە لە کرو خزمەتی قورئانی پیرۆزدا کردم • چونکە جاران لە کاتی دەرسـدا ماموستا بە تایبەتی نوی منی دەهێنا ، جگە لە هەڵسانم بە نووسینەوەی مسوەددەکان • جا کشانەوەم لە مەیدانەکە ، بە تایبەتی لە نووسینەوەی مسوەددەکان ، ئەوانی خستە ئازارو ناڕەحەتی یەوە •

بەهەرحاڵ ، سوپاس تەنها بۆ خوای گەورە کە تێی گەیاندین چ زیانێکمان کردووە بە بۆنەی ئەم سستبوونەمان لە کارکردنداو ، هانی داین جارێکی تر بچینەوە ناو ڕیزی کارگوزارانی خزمەتی قورئانو فێری کردین کە ئەم بانگەوازە پیرۆزەی قورئان بانگەوازێکی چەندە بەرزەو ، ئنجا باوەڕمان پەیداکرد کە ڕابەرێکی گەورەی وەك گەیلانی پشتگیری کارەکەمانەو ، وەکو مەلائیکەت دەبێتە پاسەوانی ئەم بانگە پیرۆزە •

بەندەی هەرەلاواز
**حافظ خالید**

★ **چواردەهەم : بریتی‌یە لە « سێ » زلله‌ی میهرەبانی کە لە « سێ » مستەفا ناو دران •**

**یەکەمیان : « مستەفا چاویش »ە •**

ئـــەم برایـــە خزمەتی مزکەوتە بچووکەکەی گرتبووە ئەستۆ • نەوت‌کـــردنە سۆپەو ئامادەکردنی شقارتەش ، لەماوەی هەشت ساڵی ڕەبەقدا ، ئەم پێی هەڵدەستاو ، وەك دوایی زانیمان پارەی هەموو ئەمانەی لە گیرفانی خۆی دەدا • ئنجا لە نوێژی جەماعەت ، بە تایبەتی لـــە شەوانی جومعەدا ، مەگەر کارێکی زۆر پێویســـت ناچـــاری بکـــردایە ، دەنا هـــەرگیز دوانەدەکەوت •

ڕۆژێکیان یـەکێ لە ئەهلی دنیا دەرفەتی لـــە دڵپاکی ئـەم وەرگرتبوو و پێی‌وتبوو : « بـە حافظ فلان بلێ ـ کـــە یەکێکـە لە نووسەرانی پەیامەکانی نوور ـ مێزەرەکەی لەسەر دابگرێ ، پێش ئـەوەی ئازار بدرێ ، بە جەماعەتی مزگەوتیش بلێ بە دزی‌یەوە

بانگ نەدەن »(١٠) •

ئــەو مرۆڤــە دنیــاییەیە بێ ئاگایــە نەیدەزانی گەیاندنی ئەم هەواڵە بە لای یەکێکی ڕۆحبەرزی وەك مستەفا چاویشەوە کرێکی قورسە • بەڵام مستەفا لەبەر دەروونپاکیی خۆی هەواڵەکەی گەیاندبوو ••

هەر ئەو شەوە لە خەودا مستەفام دی ، هەردوو دەستی پیس بووبوونو لــە پشت ســەری قایمقامەوە دەڕۆیشتو بە یەکەوە دەهاتنە ژوورەکەم !

بۆ بــەیانی پێموت : برام مستەفا ! ئەمڕۆ کێت دیوە ؟ لـــە خـــەوما تۆم دی هەردوو دەستت پیس بووبوونو لە پشت سەری قایمقامەوە دڕۆشتی ؟

---

(١٠) مەبەست ئەوەیە ئــەوان دوو بانگیان دەدا • یەکەمیان بە ئاشکراو بە شێوە بیدعییەکەی کە سەپێنرابوو • دووهــەمیان بە دزییەوەو بــە شێوەی شەرعی لەناو مزگەوتەکەدا •

[ وەرگێڕ ]

وتی : ئەی داخی گرانم ! کوێخکە قسەیەکی پێڕاکەیاندم کـــە بە خوەنەکەی بکەیەنم ، منیش نەمزانی چ فێلێکی تێدایە •

هەر لـەو ڕۆژەدا هەندێ نەوتی بۆ مزگەوت هێنابوو و ، بە پێچەوانەی جاران ، دەرگای مزگەوت ئەو ڕۆژە کرابووەوە و بزنێك ڕۆشتبووە ناو حەرەمی مزگەوتەوەو جێی بەرماڵەکـــەمی پیس کردبوو • ئنجا یەکێکی‌تر ویستبووی ئـــەو جێگایە بشوات ، هیچی دەست نەکەوتبوو نەوتەکە نەبێ • ئـــەویش بێ‌ئەوەی بۆنی نـــەوت بکات بـــە ئەوی زانیبوو و بەرماڵەکەی پێ‌شۆردبوو ، بە پاشماوەکەشی ئەوپشێنی دەوروبـــەری مزکـــەوتی کـــردبوو ! وەك بڵێی مزگەوتەکە بـــە زمانی حاڵ بـــە « مستەفا چاویش » دەڵێ :

« لەمەولا پێویستمان بە نەوتی تۆ نییە ، چونکە هەڵەیەکی گەورەت کرد » •

هەستنەکردنی ئەو کەسەش بە بۆنی نەوتەکە ئاماژەیە بۆ ئەم قسە مەعنەوی‌یەی مزگەوتەکە • بگرە ئەو ڕۆژە و شەوی جومعەی پیرۆزیش مستەفا نەیتوانی بەشداریی نوێژی جەماعەت بکات ، هــەرچەندەش هەوڵی دابوو بێتو بەشداری بکات •

پاشان بــە چەشنێکی پاکو بێ گەرد پەشیمان بووەوەو ، بە دڵێکی بە کوڵەوەو پاڕانەوەی زۆرەوە داوای لێبوردنی لە دەرگانەی خوای گەورە کردو – سوپاس بۆ خوا – بەم جۆرە دڵپاکی‌و عیبادەتپاکی‌ی دەست کەوتەوە •

**دوو مستەفا ناوەکەی‌تر •**

یەکەمیان : « مستەفا ئونلی »یە ، کە لە قوتابی‌یە چالاکەکانەو ، ئەوی تریان : هاوەڵە بە وەفاکەیەتی ، کە « حافظ مستەفا »یە •

لەو کاتەدا بە قوتابییانم ڕاگەیاندبوو کە نامەوێ لە جەژندا هیچ کەسێ سەرم لێبدات ، مەگەر تاکە

کەسی • چونکە چاودێری و تەنگ پێ هەڵچنینی ئەهلی دنیا لەو کاتەدا لەسەرم زۆر توند بوو • کەچی دەبینم کتوپڕ سێ کەس بەیەکەوە شەوهاتن بۆ لام و، ئەگەر باری کەش بۆ سەفەر لەبار بێ، ئەوا دەشیانەوێ بەیانی شەبەق بڕۆن • ئیتر نە من و نە سولەیمان و نە مستەفا چاویش هیچ تەگبیرێکمان بۆ حەزەرکردن نەکردو، هەریەکەمان ئەم کارەی خستبووە ئەستۆی ئەوی ترەوە ••

بە هەرحاڵ، ئەوان پێش نوێژی بەیانی خواحافیزیان لێ کردین و ڕۆشتن •• ئەوەبوو زللەکەیان لێدرا • ئەویش بریتی بوو لە تۆفێکی سەختی ئەوتۆ کە بە درێژایی ئەو زستانە شتی وامان نەدیبوو و دوو سەعاتی خایاند • ئێمەش خەمی ئەوان دایگرتین و دەمانوت ڕزگاریان نابێ • ئەوەندە خەفەتم بۆ خواردن بۆ کەس وا خەفەتم نەخواردووە• پاشان ویستم سولەیمان بنێرم بۆ هەواڵ زانینیان

ـ چونکە حسابی تەکبیری حەزەرکردنی نەکرد ـ

بەڵام مستەفا چاویش وتی :

ئەگەر سولەیمان بڕوات ، ئەویش لەوێ گیردەخواو نتوانێ بێتەوە ، ئنجا منیش دەبێ بچم بە دوایداو لەوێ دەمێنمەوە •• وە هەروەها ••

لەبەر ئەوە کارەکەمان دایە دەست خواوەندی گەورەی بە تواناو ، هەموومان بە یەکدەنگ وتمان :

« توکلنا علی الله » •

★ ★ ★

**لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش ، ئەویش ئەمەیە :**

« ئەو بەڵاو موسیبەتانەی دێنە ڕێگەی برا تایبەتەکانو برادەرەکانت ، تۆ بە تەمێ کردنی پەروەردگاری و زللەی گلەیی یان لەقەڵەم دەدەیت ، بە هۆی سستیو کەمتەرخەمی کردنیانەوە لە خزمەتکردنی قورئاندا ، دەی خۆ ئەوانەی دوژمنی

خزمەت کردنی قورئان و دوژمنی ئێوەن ، بەوپـەڕی خۆشیو ئاسایش زیانیـان لێدەگوزەرێ ، ئیتر بـۆ ئـەوەی هاوڕێی قورئانە زللەی لێدەدرێ ، بـەڵام دوژمنەکەی هیچی تووش نابێ ؟ » .

وەڵام :

پەندێکی پڕ لە دەرس و عیبرەتی پێشینان دەڵێ : « الظلم لا يدوم ، والكفر يدوم »[11] . جا هەڵەی خزمەت گوزارانی قورئان ، وەك ئەوە وایە ستەمیان لەو خزمەتە کردبێ . ئنجا ئەگەر ئەو خزمەت گوزارانە وریابن ، ئەوا خێرا بۆ ڕێگای ڕاست دەگەڕێنەوە .. بەڵام دوژمن تەنها لە پێناوی گومڕاییدایە کە لە دژی قورئان و خزمەتی قورئان ڕادەوەستێ و ، ئەو لە سنوور دەرچوونەی کە بەرامبەر خـزمەتی قورئان دەیکات ـ بە خـۆی بزانێ یان نا ـ لـە ڕیزی کوفرو

---

(١١) واتـە : ستەم بەردەوام نابێ ، بـەڵام کوفـر بەردەوامە [ وەرگێڕ ] .

زندیقیتی‌دایه .. جا لەبەر ئەوەی کوفــر شــتێکی بەردەوامە ، ئەوا زۆربەی کافران بــەم زوویی‌یە زللەیان لێ نادرێ . چونکە هەروەك ئــەو کەسانەی تاوانی بچووکیان کردبێ ، هــەر لە « فــەزا » و « ناحیە »کاندا سزا دەدرێن ، بەڵام ئەوانەی تاوانی گەورەیان کردووە بۆ دادگا گەورەکانی « جــەزا » دەبرێن .. هەروەك ئەمە وایە ، هەر بەو جۆرەش ئەو هەڵە بچووکانەی ئیمانداران‌و هورپێیانی قورئان دەیکەن ، یەکسەرو بە زوویی هەر لە دنیادا بەشێك لە سزاکەی دەچێژن . تاکو ببێتە کەفارەتی ئەو هەڵەو گوناهنەیان‌و بە تەواوی پاکیان بکاتەوە لێی .

بەڵام تاوانی گومڕایان ، ئەوەندە گەورەیە کە ئەم دنیا کــەم‌و کورتە جێگای تۆڵە لێسەندنەوەی ئەوانی تیا نابێتەوە . لەبەر ئەوە تا کاتی هاتنەپێشەوەی جیهانی هەمیشەیی ئەودنیاو دادگای گەورەی ئەوێ ، مۆڵەت دەدرێن . تاکو عەداڵەتی پڕ لــە دادگەریی

خواوەند تۆڵەیان لێدەسێنێتەوە • لەبەر ئەوە زۆربەی جار لەم دنیایەدا سزا نادرێن •

ئەو فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ کە دەفەرموێ : « الدنیا سجن المؤمن ، وجنة الکافر »[١٢] ئاماژەیە بۆ ئەم حەقیقەتەی باسمان کرد • واتە مرۆڤی ئیماندار هەندێ سزای کەمتەرخەمی‌یەکانی هەر لەم دنیایەدا وەردەگرێ • کەواتە دنیا سەبارەت بەم ، جێگای سزاو تۆڵەسەندنەوەیە ، سەرەڕای ئەوەی کە هەر ئەم دنیایە سەبارەت بەو لەچاو ئەو نیعمەتانەی لە بەهەشتدا خوای گەورە بۆی ئامادەکردووە ، ئەشکەنجەو بەندیخانەیە • بەڵام کافران لەبەر ئەوەی بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدان ، هەندێ پاداشتی کردەوەکانیان

---

(١٢) رواه مسلم وابن ماجه والترمذي واحمد عن ابي هريرة • بڕوانە مسلم « ٢٩٥٩ » • واتە : دنیا بەندیخانەی ئیماندارو . بەهەشتی مرۆڤی کافرە • [ وەرگێڕ ] •

لەم دنیایەدا وەردەگرن‌و ، سزای تاوانە گەورەکانیان بۆ قیامەتی هەمیشەیی هەڵدەگیرێ‌و ، دنیا سەبارەت بەوانەوە جێگای نیعمـــەت‌و خۆشی‌یە . دەنا مرۆڤی ئیماندار هەر لەم دنیایەدا ئەوەندە لەزەت‌و نیعمەتی مەعنەویی دەست دەکەوێت کە بەختەوەرترینی مرۆڤ دەستی ناکەوێ ، کەواتە لە ڕاستیدا مرۆڤی ئیماندار هەر لەم دنیایەدا زۆر لە مرۆڤی کفر بەختەوەرترە . وەك بڵێی ئیمـانی مرۆڤی ئیماندار وەك بەهەشتێکی مەعنەوی وایـــە لـــە ڕۆحیداو ، کفرێتیی مرۆڤی کافریش وەك دۆزەخێکی مەعنـــەوی وایـــە لـــە ماهیەتی‌دا .

**سبحانك لا علم لنا الا ما علمتنا انك انت العليم الحكيم .**

**سەعیدی نوورسی**

## پەیامەکانی نوور بە کوردی :

خوێنەری بەڕێز !

تا ئێستا ئەم پەیامانەی خوارەوە بە کوردی دەرچوون :

١ ـ پەیامی بیماران ١٩٨٤ ·
٢ ـ پەیامی پیران ١٩٨٤ ·
٣ ـ وتە بچووکەکان ١٩٨٥ ·
٤ ـ سرووشت ١٩٨٦ ·
٥ ـ لە بارەی مەلائیکەت و ژیانی دوارۆژەوە ١٩٨٧ ·
٦ ـ پەیامی رەمەزان ١٩٨٧ ·
٧ ـ حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان ١٩٨٧ ·
٨ ـ پەیامی ئیخلاس و برایەتی ١٩٨٨ ·
٩ ـ ئەم پەیامەی بەردەستت ·

چەند پەیامێکی تریش بەڕێوەن ، بە یارمەتیی خوای میهرەبان ، رێگای چاپ و بلاوکردنەوە دەگرنەبەر ·

« **وەرگێر** »

لطمات الرأفة
من كليات رسائل النور التي الفها
بديع الزمان سعيد النورسي
ترجمها من العربية الى الكردية : فاروق رسول يحيى

* * *

The Slap Of Mercy
By:
Bediuzzaman Said Nursi
Translated from Arabic into Kurdish
By:
Faruq Rasul Yahya

* * *

رقم الايداع في دار الكتب والوثائق ببغداد
١٤٨٦ لسنة ١٩٨٩

1000
نرخى ([redacted]) فلسه

مطبعة الرشاد ـ بغداد ١٩٨٩ ـ ٧١٨